# بەرەو هەڵدێر

## سەلەفی و صۆفی دژن و هەرگیز پێکەوە کۆ نابنەوە

نوسینی

عوسمان ئەحمەد حاتەم

بسم الله الرحمن الرحيم

# بەرەو هەڵدێر

## سەلەفی و صۆفی دژن و هەرگیز پێکەوە کۆ نابنەوە

(الحمد لله الذي جعل في كلِّ زمانِ فترةٍ من الرسل بقايا من أهل العلم، يدعون من ضلَّ إلى الهدى، ويصبرون منهم على الأذى، يُحيون بكتاب الله الموتى، ويبصِّرون بنور الله أهلَ العمى، فكم من قتيلٍ لإبليس قد أحيَوْه، وكم من ضالّ تائهٍ هَدَوْه، فما أحسن أثرهم على الناس وأقبح أثر الناس عليهم! ينفون عن كتاب الله تحريفَ الغالين وانتحالَ المبطلين وتأويلَ الجاهلين، الذين عقدوا ألويةَ البدعة، وأطلقوا عِقالَ الفتنة، فهُم مختلفون في الكتاب، مخالفون للكتاب، متَّفقون على مخالفة الكتاب، يقولون على الله ، وفي الله ، وفي كتاب الله بغير علمٍ، يتكلَّمون بالمتشابه من الكلام، ويخدعون جُهَّالَ الناس بما يشبِّهون عليهم، فنعوذ بالله من فتن المضلِّين..)(الردُّ على الزنادقة والجهمية).

لەم سەردەمەدا کە غوربەتی سوننەت گەیشتووەتە لووتکە و ترۆپکی، هەموو ئوممەتەکانی کوفر و موبتەدیع و لارێکان شەڕێکی

نەگریسی ناڕەوایان دژی ئیسلام و موسڵمانان و سوننەت هەڵگیرساندووە، پێویستی بە خۆڕاگری و بەرگری و دامەزرانی زیاترە لە هەر سەردەمێکی تر، بانگخوازانی سوننەت پێویستە زیاتر خۆیان ماندوو بکەن بنەماکانی هەموو ئەو پووچەڵی و نەفامیانە ڕەت بکەنەوە کە لە دەوری ئیسلامی ڕاستەقینەیان ئاڵاندووە، و ڕوونبن لە تەڕح و گوتاریان و لەبەر خودا لە لۆمە و تانە و تەشەری هیچ لۆمەکارێك نەترسن.

کێشە و ئاریشەی نێوان حەق و باتڵ هەتاکو ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت و کۆتایی نایەت، و بەردەوامیش کەسانێك دەبن کە حەق و ڕاستی سەردەخەن و ئامادەنین ئاین و مەنهەجەکەیان بە پارە و پوول و ناوبانگ و پلەوپایە و پیاهەڵدانی خەڵك بگۆڕنەوە.

سەوبان ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لا تَزالُ طائِفَةٌ مِن أُمَّتي ظاهِرِينَ على الحَقِّ، لا يَضُرُّهُمْ مَن خَذَلَهُمْ، حتَّى يَأْتِيَ أمْرُ اللهِ وهُمْ كَذلكَ)) أخرجه مسلم.

واتە: بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەم لەسەر حەقن بەسەر نەیارەکانیان سەردەکەون، ئەوانەی سەریان ناخەن و پشتگیریان

ناکەن زیانیان پێناگەیەنن، هەتاکو قیامەت دێت کەسانێك بەوشێوەیە دەمێننەوە.

دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبکری صدیق رضي الله عنه بووە پاڵەوانی شەڕی هەڵگەڕاوەکان و بەردەوامی پێدەری ڕێبازە پیرۆزەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ، لە هەموو مێژووی پرشنگداری ئیسلامدا کە باسی شەڕی هەڵگەڕاوەکان دەکرێت باس تەنها باسی ئەبوبەکرە رضي الله عنه ئەوە لە کاتێکدا نزیکەی سەد هەزار هاوەڵ کە حەجی ماڵئاواییان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەنجام دابوو بوونیان هەبوو، و کەڵە پیاوی وەك عومەر و عوسمان و عەلی... یان تێدابوو، کەسێك لە پێشەوایانی سەلەف نەیگوتووە بۆچی ئەوەندە باسی ئەبوبەکر دەکەن و باسی عومەر و عوسمان و عەلی ئەوانی تر ناکەن.

و لە سەردەمی فیتنەی خەلقی قورئاندا پێشەوا ئەحمەد کوڕی حەنبەلی تێدا بووە سیمبول هەرچی فەزڵی ئەو چاخەیە بۆ ئەحمەد دەگەڕێنرێتەوە دوای فەزڵی خوا سبحانه وتعالى، لە کاتێکدا پێشەوایانی وەك ئەبوعبید قاسمی کوڕی سەلام و یەحیای کوڕی مەعین و عەلی کوڕی مەدینی و شافعی و بوخاری و مسلم و ئەبوداود و ترمزی و چەندەها

کەڵە پیاوی تریش بوننیان هەبوو، کەسێك نەیگوتووە بۆچی هێندە باسی ئەحمەد دەکەن و باسی شافعی و بوخاری ئیمامی دونیا لە فەرموودەدا ناکەن، ئەمە تانەدانە لەو کەڵە پیاوانە ؟!.

و لە سەردەمی هێرشی تەتار بۆ سەر وڵاتی موسڵمان ئیبن تەیمییە بووە سەرباس لە کاتێکدا تەنها قوتابییەکانی خۆی بەبیر دەهێنمەوە ئین قەیم و ئیبن کەسیر زەهەبی و ئیبن عبدالهادی ئەمانە و چەندان کەڵە زانای تریش بوونیان هەبوو، دەرکەوتنی ناوی ئیبن تەیمییە نەبووە تانە و نەنگی بۆ زانایانی تر بەڵکو بەپێچەوانەوە لەبەر ئەوەی پاڵپشتی ئیبن تەیمییەیان کرد لە حەقدا هەریەکەیان بوون بە ئیمام لە بوارێکدا بۆ نمونە: نوسراوەکانی ئیبن قەیم وەك دەگوترێت بووەتە مەرجەع بۆ هەموو ئەوانەی دوای ئەو دێن، و ئیبن کەسیر باشترین یان یەکێك لە هەرەباشترین تەفسیرەکانی قورئانی نوسیوەتەوە و زەهبی بووە گەورە مێژوونووسی ئیسلام بەبێ ڕکابەر.

هەروەها محمد کوڕی عبدالوهاب کە بووە هۆکاری زیندووکردنەوەی بیروباوەڕی تەوحید و سەلەفیەت لە نیمچە دورگەی عەرەب و هەموو دونیای ئیسلامدا، لە نزیك ئەو سەردەمەی ئەو صەنعانی و شەوکانی و

ئالوسی و چەندەها زانای تر بوونیان هەبوو، بەڵام خوا زیاتر فەزڵ و ڕێزەکەی بە نسیبی محمدی کوڕی عبدالوهابەوە کرد و بووە مایەی لە ناوبردنی خورافەت و دەمارگیری مەزهەبی، باس تەنها باسی محمدی کوڕی عبدالوهابە، کە نەیارەکانی سوننەت بە وەهابییەت ناتۆرەی لێدەنێن بۆ ئەوەی ناوی بزڕێنن.

هەتا دەگاتە ئەم چەرخەی ئێمە کە چەرخی قوڵبوونەوەی ناکۆکی بانگەوازی حەق و هەموو بانگەوازە لاڕێکانی ترە لە ئیخوان و قاعیدە و داعش و ڕافزە و قوتبی و سروری و حزبیە شاراوەکان و کۆمەڵە بەناو سەلەفیەکان...هتد.

ئێستا لەبەر ئەوەی بانگەوازی سەلەفیەت لە جیهانی ئیسلامدا بە نامۆیی نەماوەتەوە و بووەتە بڵاو و باوترین بانگەواز لە هەموو جیهاندا، و هەموو حزب و مەزهەب و ڕێچکەکانی تر لە ئاوابوونی خۆریان نزیك بوونەتەوە تەنها لەو کۆمەڵگە موسڵمانانەدا نەبێت کە ڕۆشنبیری ئاینییان لاوازە، ئەوانەی نەیار و دژن بە سەلەفیەت وەك پیشەی لە مێژینەی پێشینەکانیان تانە لەو زانایانە دەدەن کە دەبنە

سەرە ڕم لە وەڵامدانەوەی گومان و لاڕێییەکانی تاقم و گروپە گومڕاکان.

لەم سەردەمەدا محمد ئەمان جامی و موقبل کوڕی هادی وادعی خوا ڕەحمیان لێ بکات لەبەر ئەوەی توندبوون دژ بە هەموو حزب و لاڕێکان زۆرترین تانە و تەشەریان لێدەدرا، و ئێستاش ڕەبیع مەدخەلی خوا بیپارێزێت کە هەڵگری ئەو مەشخەڵە پیرۆزەیە کەوتۆتە بەرهێرشی ناڕەوای نەیارەکانی بانگەوازی سەلەفی لەبەر هیچنا تەنها لەبەر ئەوەی توندە لە دژی هەموو لاڕێکان و نەیارەکانی بانگەوازی سەلەفی.

ئەوەی زۆر جێگەی نیگەرانییە کە هەتا دوێنێ کەسانێك بەرگرییەکی زۆر سەرسەختانەیان لە ڕەبیع و مەنهەج و شێوازی کاری بانگەوازەکەی دەکرد، لە ناکاو تەواو لەوەی پێشوتریان پاشگەزبوونەوە و کەوتوونەتە تانە و تەشەردان لە ڕەبیع، سەلەفییەکان دەڵێن: مەدخەلی و ناووناتۆرەی ناشرین دەبەخشنەوە بەو کەسانەی ڕێز لەو ڕەمزانەی سەلەفییەت دەگرن.

و هەموو ئەو شوبهە و بیانووە سواوانەی کە عبدالرحمن عبدالخالق و ئەبوالحسن مەئربی و عەدنان العرعور و عەلی حەلەبی باسیان دەکرد

دووبارەی دەکەنەوە و دەڵێن: ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ لای گەورە زانایانی سەلەفی ئەم سەردەمە وەك: ئەلبانی و ئیبن باز و ئیبن عوسەیمین و فەوزان....، ئەوە لە کاتێکدا لەگەڵ ئەو زانایانەن تاوەکو ئەو کاتەی وادەبینن کە وەك ربیع سود لە گوتەکانیان دەبینن ئەگینا پشت لەوانیش هەڵدەکەن، بۆ نمونە: ئەلبانی و ئیبن باز و ئیبن عوسەیمین و فەوزان هەموویان دەڵێن: وێنەگرتن حەرامە بەڵام زۆرێك لە ئەوانەی بانگەشەی گەڕانەوە بۆ لای ئەو زانا گەورانە دەکەن وێنە دەگرن، ئێستا پرسیارە جەوهەرییەکە ئەوەیە بۆ ڕەبیع؟.

وەك زانراوە زانستەکانی ئیسلام زۆر بەرفراوانن و زۆر کەم لە مێژووی ئیسلامدا هەڵکەوتووە کەسێك هەبووبێت لە هەموو زانستەکاندا گەیشتبێتە لووتکە، بۆ نموونە شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە کە وەك دەگوترێت - غني عن التعريف - بەڵام ئەوەندەی باسی ئیبن کەسیر قوتابی دەکرێت لە تەفسیردا باسی ئیبن تەیمییە ناکرێت، هەروەها ئەوەندە باسی زەهبی قوتابی دەکرێت لە زانستی جەرح و تەعدیل دا باسی ئیبن تەیمییە ناکرێت، ئەوەش بەتانەدان ئەژمار ناکرێت لە ئیبن تیمیە بەڵکو فەزڵ و ڕێزە بۆی لەبەر ئەوەی قوتابی ئەون.

و به ئیبن حەجەری عەسقەلانی دەگوترێت خاتمەی حوفاز و له علومی حەدیس و تەصحیح و تەزعیفدا ناوێکی دیاره له مێژوودا، کەچی سەلەفییەکان لەم سەردەمه بۆ تەصحیح و تەزعیفی فەرموودە بۆ لای ئەلبانی دەگەڕێنەوە و نابێتە تانه و بێڕێزیش بۆ ئیبن حەجەر، و له فقه و ئوصولیشدا ئیبن عوسەیمین له هەمووان دیارتره و له زانستی بیروباوەڕدا ئیبن باز ناوێکی دیاره ئەگەر کەسێك باسی تەصحیح و تەزعیفی فەرموودەی لای ئیبن باز و ئیبن عوسەیمین ساغنەکردەوە بەڵگەی بێڕێزیکردن نییە بەو زانا بەڕێزانە.

و به شاهیدی هەموو زانا ناسراوە سەلەفییەکانی ئەم سەردەمە ڕەبیع له زانستی جەرح و تەعدیل دا کەسێکی لێهاتووە و بووەتە مەرجەع لەو بوارەدا، بۆیە له ناسینی حزب و مەزهەب و کەسە گومڕاکان هاوتای نییە لەم سەردەمە، ئەگەر کەسێك بۆ ناسینی کەسێکی لاڕێ نەگەڕایەوە بۆ لای زانا سەلەفییە ناسراوەکانی تر بەڵگەی بێڕێزی و بەکەم سەیرکردنی ئەو زانا بەڕێزانە نییە، بەڵکو وەك چۆن جاران دەگوترا: (لا يُفتى ومالك في المدينة)، ئێستاش وەك چۆن ئەلبانی له زانستی فەرموودە ناسیدا هەمووان بۆ لای دەگەڕێنەوە، حەقی خۆیەتی هەموو سەلەفییەك بەبێ شەرمەزاری و بەدەنگی بەرز

بڵێت: (لا يُفتى في علم الرجال والجرح والتعديل وربيع في المدينة)، چونکە ئەوە فەزلی خوایە، بیەوێت بە هەرکەسێکی دەدات.

ئەو باسەی شێخ ڕەبیع لەبەر ئەوەیە بیانووی سەرەکی گۆڕان و لادانی ئەو کەسانەی مەنهەجیان گۆڕاوە، ئەوەیە شێخ ڕەبیع مەنهەجی لەگەڵ مەنهەجی گەورە زانایانی سەردەم جیاوازە؟!، ئەوە لە کاتێکدا لەم وڵات و نیشتمانەی ئێمە ماوەیەکی زۆر بە شان و باڵی شێخ ڕەبیعیاندا هەڵدەدا، بەڵام لە ماوەیەکی پێوانەییدا هەموو ئەوەیان تەواو پێچەوانە کردەوە، لە کاتێکدا هەرکەسێك بە سەلەفییەکانی گوتبا مەدخەلی، بە کەسانی درۆزن و ڕووڕەش لە قەڵەم دەدرا و شێخ ڕەبیع بەوە باس دەکرا کە دەماری بیدعەکانیانی وشك کردووە، ئێستا نەك هەر بە مەدخەلی بەڵکو بە زۆر ناو و ناتۆەی ناشرین سەلەفییەکان ناوزەد دەکەن، لەولایشەوە بە کەسانێك کە خۆیان دەڵێن: صۆفین، دەڵێن: صۆفییەکی سەلەفین؟!.

سەرەتا بیانوویان ئەوەبوو شێخ ڕەبیع لەسەر مەنهەجی گەورە زانایان لای داوە، لە سەردەمی ئەواندا زانا و بانگخوازەکانی ئەهلی سوننەتی تەبدیع نەدەکرد، بەڵام دوای مردنی ئەو زانایانە شێخ ڕەبیع

ئێستا زانا و بانگخوازانی ئەهلی سوننەت تەبدیع دەکات و تەحزیریان لێ دەکات؟!.

بەڵام ئەوە دەسپێك و ڕێ خۆشکاری بوو بۆ پاشگەزبوونەوە لە ئەو مەنهەجەی پێشتریان، و تانە و تەشەردان لە شێخ ڕەبیع و سەلەفییەکان، و نێوانیان خۆش کرد لەگەڵ نەیارەکانی سەلەفییەت بە هەموو ڕەوتە جیاوازەکانیانەوە، بە جۆرێك نزیکن لەوەی خەتە سورەکان ببەزێنن، بە ناوی بەرژەوەندی دەعوە و برایەتی موسڵمانان.

هەندێك جار دەبیستی بە شەرمەوە دەڵێن: گەڕانەوە بۆ حەق فەزیلەتە، و شافعی مەزهەبی کۆن و نوێی هەیە، ئەمەش چەواشەکارییە، و قسەیەکی حەقە بەڵام باتڵیان پێ مەبەستە، بەڵێ ئەگەر کەسێك لەسەر باتڵ بێت پاشان تەوبە بکات و دەست هەڵبگرێت لەو باتڵە بگەڕێتەوە بۆ حەق فەزیلەتە و جێگەی شانازییە، بەڵام باسی مەزهەبی کۆن و نوێی شافعی لەو پرسە وەك جیاوازی نێوان ئاسمان و ڕێسمانە، زانراوە شافعی لە ترسی فیتنەی خەلقی قورئان لە بەغدا هەڵهات و ڕۆیشت بۆ میسر لەوێ هەندێك فەرموودەی نەبیستبوو، لە

چەند پرسێکی فقهی بۆچوونی پێشووی گۆڕی بۆ ئەو فەرموودە تازانەی کە بیستی، بەڵام نەبیسراوە لە مەنهەجی پێشووی پاشگەز بوو بێتەوە، و بڵێت: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل هەڵەیە لەوەی دەڵێت: قورئان فەرموودەی خوایە و دروستکراو نییە، ئەوە بابەتی مەزهەبی کۆن و نوێی شافعییە بە ڕەحمەت بێت.

ئێوە بۆچوون و مەنهەجتان لە زۆر شتدا گۆڕاوە و دەتانەوێت ئۆباڵی هەموو ئەو گۆڕانەشتان بخەنە ئەستۆی شێخ ڕەبیع، و پاساوی هەموو ئەو کردار و گوفتارە پێچەوانانە بدەن کە دژە لەگەڵ سەلەفییەت و کردار و گوفتاری ڕابردووی خۆتان.

هەتاکو دواجار بە کەسێك کە دەڵێت: من صۆفیم، و هیچ سیمایەکی سەلەفییانەی پێوە دیار نییە، دکتۆر دەڵێت: صۆفییەکی سەلەفیت، لە ناختانەوە دەزانن کە صۆفییەت و سەلەفییەت دوو بیروباوەڕی دژیەکن و هەرگیز مومکن نییە کەسێك لە هەمان کاتدا صۆفی بێت و سەلەفیش بێت، چونکە بانگەوازی سەلەفییەت بانگەوازی هەموو پێغەمبەرانە و پێغەمبەرانیش بانگەوازیان تەوحیدە و خوا ﷻ هەموو مرۆڤ و جنی بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزە دروست کردووە وەك

دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ٥٦﴾(الذَّارِيَات).

واتە: من جن و مرۆڤم دروست نەکردووە بۆ ئەوە نەبێت بە تەنها بمپەرستن.

و بانگەوازی صۆفییەتیش بانگەوازی پێچەوانەی تەوحید و پاڕانەوەیە لە گۆڕی پیاوچاکان و بیروباوەڕەیان وایە گۆڕەکان سود و زیان دەگەیەنن، کە ئەمە دژە لەگەڵ ناوکرۆکی تەوحید، ئیدی چۆن ئەو دوو دژە کۆ دەبنەوە؟!.

ئەمە بەرەو هەڵدێر چوون و پێداویستی مەنهەجە تازەکەتانە، کە هەوڵ دەدەن هەموو نەیارەکانی پێشووتان لە خۆتان ڕازی بکەن، لەسەر حیسابی مەنهەجی سەلەفی، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَن أرْضى اللَّهَ بِسَخَطِ النّاسِ كَفاهُ اللَّهُ، ومَن أسْخَطَ اللَّهَ بِرِضا النّاسِ وكَلَهُ اللَّهُ إلى النّاسِ)) أخرجه ابن حبان و صححه الألباني.

واتە: هەرکەسێك خوا ﷻ ڕازی بکات بە تورە کردنی خەڵك، خوای بەسە و دەیپارێزێت، و هەرکەسێك خوا تورە بکات لەبەر ڕەزامەندی خەڵك، خوا بە خەڵکی دەسپێرێت.

و شافعی رحمه الله دەڵێت: (رِضا النّاسِ غايَةٌ لا تُدْرَكُ).

واتە: بە دەست هێنانی ڕەزامەندی خەڵك ئامانجێكە بە دەست نایەت.

دڵنیابن ناتوانن خەڵك ڕازی بكەن، باشە گریمان لە ڕابڕدووتان هیچ ڕوونەداوە، وەرن لەگەڵ عەقڵتاندا بدوێن، و تەنها ئەم مەوقیفەی كۆتایتان موناقەشە بكەین، ئەمە چەند قسەیەكی كەمی مەلا مەزهەرە كە دكتۆر پێی دەڵێت: صۆفییەكی سەلەفیت، و باشیت ماشاء الله ئێستا باسی بیدعە و شیرك دەكەیت؟!.

١ . ئەو كابرایە لە دیدارێكی تەلەفزیۆنیدا كە خۆی خاوەنی تەلەفزیۆنەكەیە و خۆی دانیشتنەكە هەڵدەسوڕێنێت، لەگەڵ كەسێكی قبوریدا دانیشتوو پرسیاری لێ دەكات دەڵێت: مەدەد یا شێخ عبدالقادری گەیلانی، یان مەدەد یارسول الله، چۆنی جێ بكەینەوە لە ئایندا؟ ئایا دروستە، و ئەچێتە قالبی شیركەوە؟.

قبورییەكە لە وەڵامیدا دەڵێت: بە نیسبەتی مەدەد یا شێخ عبدالقادری گەیلانی، یان مەدەد یا رسول الله، و الله كاكە گیان نەك

جارێك، سەدان جار وامان وتووە، و باوەڕمان وایە هاوارکردنە شێخ عبدالقادری گەیلانی هاوارکردنە خوایە؟!.

لە دوای ئەو قسانە مەلا مەزهەر، بەبێ ئەوەی هیچ نکولی بکات وەك ئیقرارێك بە کابرای قبوری دەڵێت: دەست خۆشی بۆ جەنابت، بە ئەوپەڕی شانازییەوە لە خزمەتتدابووین و شەرەفمەندبووین...

دەگوێ بگرن ئەی ئەوانەی دەڵێن: ئێمە شوێنکەوتەی زانایانین بزانن ئیبن باز سەبارەت بە داوای یارمەتی کردن لە مردوو چی دەڵێت: (ئەم قسەیە لە شیرکی گەورەیە، و مانای ئەوەیە داوای یارمەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرێت، و زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ و شوێنکەوتەکانیان و زانایانی سوننەت کۆڕان لەسەر ئەوەی داوای یارمەتی کردن لە پێغەمبەران کە مردوون یان جگە لەوان ، یان لەو کەسانەی ئامادەنین لە فریشتەکان و جن و جگە لەوانیش یان بت و بەرد و ئەستێرەکان و هاوشێوەی ئەوانە لە شیرکی گەورەیە..)(مجموع فتاوی ومقالات)(٧/٤٢٠).

لەبەر زۆر درێژە نەدان بەو باسە بەڵگەکانی تر لە ئایەت و فەرموودە و قسەی زانایان لەسەر ئەو پرسە باس ناکەم، بەڵام

سەرنجتان بۆ ئەوە ڕادەکێشم کە ئیبن باز بە ڕەحمەت بێت کۆ دەنگی هەموو صەحابە و زانایان باس دەکات لەسەر ئەوەی مەدەد یا رسول الله شیرکی گەورەیە، واتە: خاوەنەکەی ئەگەر عوزری نەفامی نەبێت لە ئاینی ئیسلام دەردەچێت.

ئەمە خاڵی ناکۆکی هەموو پێغەمبەران بووە لەگەڵ نەیارەکانیان، و دژایەتیان کردووە، و خوا ﷻ مرۆڤ و جنی بۆ تەوحید و بە تەنها پەرستنی خۆی دروست کردووە، دەبوو ئەم خاڵە بەربەست بووایە لەگەڵ ئەو کەسانە کۆ ببنەوە، و دژ و ناکۆك بوونایە لەگەڵیان هەتاکو تەبەڕایان لەوە دەکرد و تەوبەیان دەکرد، نەوەك خۆی بڵێت: من صۆفیم، تۆ پێی بڵێیت: صۆفییەکی سەلەفیت!!.

٢ . دکتۆر زۆر فەخر و شانازی بەوەوە دەکات کە دژی توندڕەوی و داعش و خەوارجەکانە، زانراوە کۆڵەکە و ناوکرۆکی بیری داعش و خەوارجەکان کافرکردنی حکومەت و دەسەڵاتدارانی وڵاتانی موسڵمانانە، گوێ لە صۆفییە سەلەفییەکە بگرن، چی دەڵێت: (من کوردستان بە دار عەلمانی دەزانم، و سعودییەشم پێ دار ئیسلام نییە).

ئەو کەسەی کەمێك شارەزای ئەدەبیاتی داعش و قاعیدە و خەوارجەکان بێت باش دەزانێت دابەشکردنی وڵات بۆ دار کوفر و دار ئیسلام لای ئەوان بەو مانایەیە هەر وڵاتێك بە پێوەری ئەوان دار الکفر بێت جیهادی لە دژ ڕادەگەیەنن و سەر و ماڵ و خوێنی خەڵکەکەی حەڵاڵ دەکەن و هەموو دانیشتوانەکەی کافر دەکەن، بە ڕاستی تەنها ئەمەش بەس بوو پاڵنەرت بێت لە خوا بترسیت، و بە کەسێك ئەوە بیروباوڕی بێت نەڵێت: صۆفییەکی سەلەفی؟!.

٣ . گاڵتەکردن بە ڕیش، لە گرتە ڤیدیۆیەکدا مەلا مەزهەر گاڵتە بە ڕیش دانان دەکات، دەڵێت: (کاکەم هاتووە بە کۆڵێك ڕدێنەوە، والعیاذ باللە، بۆیە ڕدێنەکەم هەردەیتراشم لە داخی ئەوانە، بە خوا مورتاحم، لە داخی کۆمەڵێ ڕدێن، ڕدێن هەر نایهێڵمەوە، هەتا ئەو ڕدێنانە هەبن نایهێڵمەوە، کەس بەو ڕدێنانە نەخەڵەتێت).

و دکتۆر لە گرتە ڤیدۆییەکدا دەڵێت: (کەسێك گاڵتە بە ڕیش بکات، واللەی قد کفرتم بعد إیمانکم، یەکسەر کافر بووی، سوێند بە خوا ژنت هەبێت لەمەودوا لێت حەرامە، ژنی تۆ نییە بایەکسەر بچێت شوو بکاتەوە، لە دینی خوا دەرچوویت کۆتایت پێهات).

٤ . فەتوای شاز و بێسەر و بەر، بۆ نموونە لە قسەیەکدا باسی ئافرەتێك دەکات و دەڵێت: (بۆیە تەماشام کرد ئەگەر جوان بووایە تەماشام نەدەکرد ئەبووە نەزەر، بەڵام الحمدلله جوان نەبوو، لە ڕووی شەرعیشەوە ئەگەر ئافرەتێك جوان نەبێت تەماشای بکەیت ئیعتیادییە).

ئەمانە و چەندان قسەی سەیر و سەمەرە و بێ بنەمای تر، بە ناوی مامۆستای ئاینییەوە، کە زۆرجار بە شێوەیەکی گاڵتەئامێز باس و پرسەکان دەوروژێنێت، پێویستە ئاین و زانست لەو جۆرە شێوازانە دوور ڕابگیرێن...

ئەگەر کەسێك سیمای بەوشێوەیە بێت، و ئەو جۆرە گوفتار و کردارانە ئاکاری بێت، جەریمەیە پێی بگوترێت سەلەفی، و تێکەڵ کردنی حەق و باتڵە، و گومڕایی و سەرلێ شێوانە، لەولایشەوە بە سەلەفییەکان بڵێت: مەدخەلی و تەبدیعی؟!.

(اللهم أرني الحقَّ حقًّا وأرزقني اتِّباعَه، وأرني الباطل باطلًا وارزُقنِي اجتنابه)